


# مسائل الجاهلية

## بەکوردی

گرنگترین ئەو بابەتانەی کە ئیسلام
پێچەوانەی ئەهلی نەفامی جوڵاوەتەوە

دانانی شێخ

موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب (رحمه الله)

کۆچکردوی ساڵی ١٢٠٦ ک

مەسائیلی جاهیلی

# گرنگترین ئەوبابەتانەی کە ئیسلام پێچەوانەی ئەهلی نەفامی جوڵاوەتەوە


نوسینی: شێخ

موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب ﵀


کۆچکردووی ساڵی 1206 ک

# پێشەکی

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه ومن والاه، أما بعد:

زۆرێك لە وێنەكانی جاهیلی یەكەم كەبەربڵاوبوو لە پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ تاوەكو ئێستا هەر ئاشكرا وبەرچاوە لەسەردەمی ئێمە، وە بەڕاستی سیفەتەكانی ئەهلی جاهیلی لەسەدەكانی پێشوو، تاوەكو ئێستا زۆرێك لە ئەهلی جاهیلیەكانی ئەم چەرخ وسەردەمەی ئێمە خویان پێگرتوە، بەڵكو چەند تایبەتمەندیەكی خراپتر وناشیرنتریان بۆی زیادكرد!

بەڕاستی ئەم تایبەتمەندیانە لە سەردەمی ئێمە بڵاوبوەتەوە بەوێنەی بڵاوبوونەوەی ئاگر بەناو پوش وپەڵاش، لەژێر سێبەری فەرمانڕەوایەتی تاغوتەکانی عەرەب کە کوفر وبیدعە وکەمایەتی بڵاودەکەنەوە و لەدژی تەوحید وسونەت وچاکەکاری دەجەنگن؛

بۆیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە بابەتە جاهیلیەکان بزانێت، ولێیان دوربکەوێتەوە، وخەڵك ئاگادار بکاتەوە لێیان و لەوانەش پەیڕەوی دەکەن.

بەڕاستی شێخ محمد کوڕی عبدالوهاب ترسناکترین[1] ئەو بابەتە جاهیلیانەی کۆکردوەتەوە لە نامەیەکی ناوازەی گەورە وبەسود، کە لەناو ئەهلی زانست ناسراوە بە (مسائل الجاهلیة)، پێویستە هەمو وموسڵمانێك بیخوێنێتەوە کاری پێبکات، بەڕاستی اللە تعالی لێکۆڵینەوەی ئەو پەیامەی بۆ ئاسانکردین دوای بەراوردکردنی لەسەر چەندین نوسخە وتیراژ، وە لێدوانمان لەسەر ئەوە نوسیوە کە پێویستە بۆ ڕونکردنەوە، داوا لە اللە دەکەین کە

[1] محمدی کوڕی عبدالوهاب کوڕی سولەیمانی کوڕی عەلی تەمیمی نەجدی کە پێشەوای نوێکەرەوەیە لەدایکبووی ساڵی 1115 ك لە شارۆچکەی (العیینة) کە ئێستا دەکەوێتە باکوری ڕیاز، وە لە ساڵی 1206 ک کۆچی دوای کردوە

ڕەحم بکات بە دانەرەکەی ولەوانەش قبوڵ بکات کە بەشداربوون لەبڵاوبوونەوەی، وە سود بە موسڵمانان بگەیەنێت.

**شێخ موحەممەدی کوڕی عبدالوهاب ﵀ دەڵێت:**

ئەوکاروبار و فەرمانانە کە پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ئەهلی جاهیلی کردوە لە خاوەن کتێبەکان و نەخوێندەواران، ئەوانەی کە پێویستە موسڵمان بیزانێت.

**فالضِّد يظهرُ حُسْنَهُ الضِّدُّ**

**وَبِضدِّها تتميز الأشْياءُ**

**جا دژیش دژەکەی جوانیەکەی دەکات ئاشکرا**

**وە هەربەدژەکەی شتگەلێك دەبن ئاشکرا**

لەهەمویان ترسناکتر باوەڕنەهێنانە لە دڵەوە بەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هێناویەتی ئەگەر لەسەر ئەوە ئەو شتە زیاد بکەی بۆی کە ئەهلی جاهیلیەت لەسەری بوون؛ ئەوە دۆڕانەکە تەواو دەبێت، هەروەك اللّٰه تعالى فەرمویەتی: {وَالَّذِينَ آمَنُوا بِالْبَاطِلِ وَكَفَرُوا بِاللَّهِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ} [العنكبوت: 52]. واتا: (وە کەسانێك کەباوەڕیان هێناوە بەبەتاڵ وبێباوەڕبوون بە پەروەردگار هەر ئەوانەن زەرەرمەندن).

**بابەتی یەکەم:** ئەوان پیاوچاکان دەکەن بەهاوبەشی اللّٰه لە دوعا عیبادەتکردنیدا، داوای شەفاعەتی لای پەروەردگاریان لێدەکەن، بەگومانی

ئەوەی کە اللە ئەو بەندە چاکانەی خۆش دەوێت، هەروەك اللە تعالى دەفەرموێت: {وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنْفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَؤُلَاءِ شُفَعَاؤُنَا عِنْدَ اللَّهِ} [يونس: 18]. واتا: (ئەوانەی جگە لەپەروەردگار شتانێك دەپەرستن کە نەزیانیان پێدەگەیەنن و نەسود وەدەڵێن ئەوانە تکاکارمانن لای اللە).

وە دەفەرموێت: {وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى} [الزمر: 3]. واتا: وەکەسانێك جگە لە اللە چەند پشتیوان وپەرستراوێکیان بۆخۆیان داناوە ودەڵێن تەنها لەبەر ئەوە دەیانپەرستین نزیکمان بکەنەوە لە اللە).

ئەوەش لە گەورەترین بابەتە کە تیایدا پێغەمبەر ﷺ دژایەتی کردوون وئیخڵاصی هێنا، وە هەواڵی دا کە ئەوە ئاینی الله_یە کە هەموو پێغەمبەرانی بەوە ناردووە، وە الله تعالی هیچ کردارێك وەرناگرێت بەبێ ئیخڵاص، وە هەواڵی داوە کە هەرکەسێك کارێك بکات لەوەی ئەوان بەچاکیان داناوە ئەوە الله بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات وشوێن وجێگەیان دۆزەخ دەبێت.

ئەو مەسەلە ئەوەیە کە خەڵك لەسەری جیادەبێتەوە بۆ کافر وموسڵمان، ئەوکاتەش دوژمنایەتی ڕودەدات، هەر لەبەر ئەوەشە کە جیهاد دانداروە هەروەك الله تعالی دەفەرموێت: {وَقَاتِلُوهُمْ

حَتَّى لا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ للّهِ} [الأنفال: ٩٣] . واتا: (وە ئەی باوەڕداران بجەنگن دژی بێباوەڕان تا -کوفر وبێباوەڕی- بەرپا نەبێت وکۆتایی پێبێت وئاین وملکەچبوون هەمووی بۆ الله تعالی دەبێت).

**بابەتی دووەم:** ئەوان جیاوازن لە ئاینەکەیان، هەروەك الله تعالی دەفەرموێت: {كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ} [المؤمنون: 53]. واتا: (جا هەر کۆمەڵ وحیبزێکیان دڵخۆشن بەو -بەشە ئاینەی- هەیانە)

بەهەمان شێوە لەدونیاشیاندا، وە وای دەبینن کە ئەوە ڕاستیەکەیە.

جا الله تعالى كۆبوونەوەيەك ويەكڕيزيەكى هێناوە لەسەر ئاين بە فەرمايشتى: {شَرَعَ لَكُمْ مِنَ الدِّينِ مَا وَصَّى بِهِ نُوحاً وَالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَى وَعِيسَى أَنْ أَقِيمُوا الدِّينَ وَلا تَتَفَرَّقُوا فِيهِ} [الشورى: ١٣]. واتا: (ئەو ئاينەى بۆ داناوون كە فەرمانى داوە بەنوح وئەوەش كە بەوەحى ناردومانە بۆتۆ ئەوەش كە فەرمانمان داوە بە ئيبڕاهيم وموسا وعيسا كە لەسەر ئەو ئاينەبن وجێبەجێى بكەن وكارى پێبكەن بەڕاستى وجياوازى تێدا مەكەن).

وە فەرمويەتى: {إِنَّ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعاً لَسْتَ مِنْهُمْ فِي شَيْءٍ} [الأنعام: 159] واتا: (بەڕاستى ئەوانەى كە ئاينەكەيان پارچەپارچە كرد

وهەڵیانوەشاند وبوون بە چەند دەستە وتاقمێکەوە تۆ لەهیچ شتێکدا لەئەوان نیت). وە ڕێگری کردوە لە خۆچواندن پێیان بە فەرمایشتی: {وَلا تَكُونُوا كَالَّذِينَ تَفَرَّقُوا وَاخْتَلَفُوا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْبَيِّنَاتُ} [آل عمران: 105]، وە نەهی لێکردووین پەرتەوازەبین لە ئاینمان بە فەرمایشتی: {وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعاً وَلا تَفَرَّقُوا} [آل عمران: 103].

**بابەتی سێیەم:** بێگوێکردن وپێچەوانەکردنی وەلی ئەمر وملکەچ نەبوون بۆی چاکە وڕێزە، وە گوێگری وگوێڕایەڵی زەلیلی وسوکیە.

جا پێغەمبەر ﷺ پێچەوانەی ئەوانی کرد وە فەرمانی کرد بە ئارامگرتن لەسەر ستەمی وەلی ئەمرەکان، وە فەرمانی کرد بە گوێگرتن وگوێڕایەڵی بۆیان وئامۆژگاریکردنیان، توند وپێداگری کرد لەو بابەتە ورونی کردەوە وجەختی لەسەر کردەوە.

وە ئەوەی ئەم سێ بابەتەی کۆکردوەتەوە ئەو فەرموودەیە کە بە صەحیحی هاتوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرمویەتی: (إِنَّ اللّٰهَ يَرْضَى لَكُمْ ثَلاَثًا: أَنْ تَعْبُدُوهُ، وَلاَ تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا، وَأَنْ تَعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللّٰهِ جَمِيعًاوَلَا تَفَرَّقُوا، وَأَنْ تَنَاصَحُوا مَنْ وَلاَّهُ اللّٰهُ أَمْرَكُمْ) [متفق عليه].

واتا: (بەڕاستی اللە لە سێ شت ڕازیە بۆتان، بەوەی کە بیپەرستن، وە هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن، وە دەستبگرتن بە ئاینەکەیەوە بە یەکگرتوویی وپەرتەوازە مەبن، وە ئامۆژگاری ئەوە بکەن کە اللە لەسەرتانی کردوە بە ئەمیر).
وە هیچ کاتێك کەم وکورتی ڕونادات لەئاین ودونیای خەڵکی ئیلا بە وازهێنان لەم سیانە یان بەشێك لەم سیانە.

**بابەتی چوارەم:** بەڕاستی ئاینیان دامەزراوە لەسەر کۆمەڵێك بناغە گەورەترینیان چاولێکەری ولاساییکردنەوەیە، جا ئەوە بنچینەی هەرە گەورەیە

لای هەموو کافران، سەرەتا وکۆتاییان، هەروەك اللّٰه تعالی فەرمویەتی: {وَكَذَلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِنْ قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِنْ نَذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِمْ مُقْتَدُونَ} [الزخرف: 23]، واتا: (هەروەها پێش تۆ هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە لە ئاوەدانییەك مەگەر خۆشگوزەرانکانی وتویانە بەڕاستی ئێمە باوك وباپیرانی خۆمان لەسەر ئاینێك بینیوە، وە بەڕاستی ئێمە لەسەر ئاینی ئەوان دەڕۆین). وەفەرمویەتی: {وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ الشَّيْطَانُ يَدْعُوهُمْ إِلَى عَذَابِ السَّعِيرِ} [لقمان: 21]. واتا: (وە هەرکاتێك پێیان بگوترێت شوێنی ئەو ئاینە

بکەون کە اللە تعالی ناردویەتیە خوارەوە دەڵێن بەڵکو ئێمە شوێن ئەو ئاینە دەکەوین کە باوك وباپیرانمان لەسەری بوون ئەگەرچی شەیتان بانگیان بکات بۆ سزای بەئێش وئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ).

جا ئەوکات بۆیان هات بە فەرمایشتی: {قُلْ إِنَّمَا أَعِظُكُمْ بِوَاحِدَةٍ أَنْ تَقُومُوا لِلَّهِ مَثْنَى وَفُرَادَى ثُمَّ تَتَفَكَّرُوا مَا بِصَاحِبِكُمْ مِنْ جِنَّةٍ ... } [سبأ: 46]، واتا: (بڵێ من بەیەك شت ئامۆژگاریتان دەکەم کە دوان دوان ویەك یەك هەڵسن بۆلای پەروەردگار پاشان بیرکەنەوە کە هاوڕێکەتان پێغەمبەر ﷺ هیچ شێتیەکی نیە). وە فەرمایشتی: {اتَّبِعُوا مَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ

مِنْ رَبِّكُمْ وَلا تَتَّبِعُوا مِنْ دُونِهِ أَوْلِيَاءَ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ} [الأعراف: 3]. واتا: (شوێن ئەوە بکەون کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە هێنراوەتە خوارەوە بۆتان وە جگە لە الله تعالى شوێنی هیچ دۆست وپەرستراوێکی تر مەکەن، کەسانێکی کەم هەن لەئێوە بیردەکەنەوە).

**بابەتی پێنجەم:** لەهەرە گەورەترین بنچینەکانیان بریتیە لە لەخۆبایبوون وسەرسامبوون بە زۆرینە، وە دەیکەنە بەڵگە بۆ دروستی شتێك، وە نامۆیی کەمی ئەهل وشوێنکەوتە دەکەنە بەڵگەی پوچی ونادروستی شتێك.

جا بەدژی ئەوە بۆیان هات وە ڕونی کردەوە لە چەندین شوێن لە قورئان [1]

شەشەم: بەڵگە هێنانەوە بە پێشینەکان، وك فەرمایشتی: {قَالَ فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَى} [طه: 51]. واتا: (گوتی ئەی خەڵکانی سەردەمە پێشوەکان حاڵیان چیە وچۆنە لەپاش مردنیان، {وَمَا سَمِعْنَا بِهَذَا فِي آبَائِنَا الْأَوَّلِينَ} [المؤمنون: 24]. واتا: (وامان نەبیستوە لەباوك وباپیرانی پێشوومان).

---

[1] وەك دەفەرموێت: (إِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) وەفەرمویەتی: (وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِمْ مِنْ عَهْدٍ وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ)، وەفەرمویەتی ﷻ: (وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ) ... تا كۆتایی.

**بابەتی حەوتەم:** بەڵگەهێنانەوە بە گەلێك كە هێز وتێگەیشت وكاری پێدرابێت وە لە دەسەڵات وسامان وپلە وپایە، الله وەڵامی دانەوە بە فەرمایشتی: {وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِنْ مَكَّنَّاكُمْ فِيهِ} [الأحقاف: 26] واتا: (بەڕاستی ئەوەی بەوان -گەلی عاد- ماندابوو - لەسامان ودەسەڵات- بە ئێوەمان نەدابوو)، وەفەرمایشتی: {وَكَانُوا مِنْ قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى الَّذِينَ كَفَرُوا فَلَمَّا جَاءَهُمْ مَا عَرَفُوا كَفَرُوا بِهِ} [البقرة: 89]، واتا: (وە ئەوان لەمەو پێش داوای سەركەوتنیان دەكرد لە پەروەردگار بەسەر ئەوانەی بێباوەڕبوون كەچی كاتێك پێغەمبەریان بۆهات كەیانناسی باوەڕیان پێنەهێنا)، وفەرمایشتی: {يَعْرِفُونَهُ كَمَا

يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمْ} [البقرة: 146][1]. واتا: (ئەوان پێغەمبەر دەناسن چۆن ڕۆڵە و وەچەکانی خۆیان دەناسن).

[1] ئەو پێوانەیەی کە ئەهلی جاهیلی بۆ حەق وباتیلی دایدەنێت: بریتیە لە ئەوەی کە هەموو خاوەنی هێز وزانست وپلە وپایە ودەوڵەمەندەکان لەسەری بن ئەوە ڕاستیە، هەرچەندە کە خۆی لەڕاستیدا پوچ وباتیڵ بێت! ئەوان وای دەبینن کە حەق بەردەوام لەگەڵ گەورەکانی گەلەکان وزیرەك ودەوڵەمەند وخاوەن پلەکانیانە، وە سادەکان وهەژارەکان شتێکی ئاساییە کە ئەوان حەق نازانن!

وە تاوەکو ئێستا ئەهلی جاهیلی ئەم سەردەمە حەق وباتیڵ پێوانە دەکەن بە پێوانەی جاهیلی، دەڵێن کە ئەوروپا وئەمریکا وکەنداو لەسەر حەقن لەبەر ئەوەی ئەوان زەویان ئاوەدان کردەوە وە شارەزابوون لە زانستەکان وژیانی خۆشیان دا بە گەلەکانیان، وە زاناکانی دەسەڵات خاوەن ماجستێر ودکتۆرا

وبەناوبانگەکان لە کەناڵ سەکۆ وکۆنگرەکان... ئەوان لەپێشترن لە ناسینی ئاین وحەق!

ئەمە لەکاتێکدا کە اللە تعالی ئەم مەرج وپێوەرانەی باتڵ وپوچ کردوەتەوە لەچەندین ئایەت لەقورئانەکەی، جا بەڕاستی اللە لەسەر نەتەوە کافرەکانی پێشوو فەرمویەتی: {وَكَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً}، {هُمْ أَشَدُّ مِنْهُمْ بَطْشًا}، {أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ *إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ*الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ}، بەهەمان شێوە ئەو ئایەتانەی کە دانەر هێناویەتیەوە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئەهلی کیتاب دڵنیابوون وزانستی تەواویان هەبوو لەسەر پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ، نەتەوەکانی پێشوو لەسەر هێزی جەستەیی زانست بوون وزیرەك ودەوڵەمەند بوون.... زیاتر لە نەتەوە کافرەکانی ئەم سەردەمە، ئایا ئەوانە لەسەر حەق بوون؟! ئایا زانست وهێز ودەوڵەمەندیان سودی هەبو وبۆیان وپارستنی لەسزا وتورەیی اللە! اللە تعالی دەفەرموێت: {وَلَقَدْ مَكَّنَّاهُمْ فِيمَا إِنْ مَكَّنَّاكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَارًا وَأَفْئِدَةً فَمَا أَغْنَى عَنْهُمْ

**بابەتی هەشتەم: بەڵگە هێنانەوە لەسەر پوچی شتێك بەوەی کە جگە لەلاوازەکان کەس شوێنی نەکەوتووە**، وەك فەرمایشتی الله: {أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ} [الشعراء: 111] واتا: (وتیان ئایا چۆنە باوەڕ بەتۆ بێنین لەکاتێکدا ئەوانەی شوێنت کەوتون لەلاوازترین کەسەکانن)، وە فەرمایشتی: {أَهَؤُلاءِ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْهِمْ مِنْ بَيْنِنَا} [الأنعام: 53]. واتا: (ئایا ئەوانە پەروەردگار ڕێزی لێناون ومنەتی خستۆتە سەریان لەسەر ئێمەدان لەناو ئێمەدا هەڵیبژاردون؟).

---

سَمْعُهُمْ وَلَا أَبْصَارُهُمْ وَلَا أَفْئِدَتُهُمْ مِنْ شَيْءٍ إِذْ كَانُوا يَجْحَدُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَحَاقَ بِهِمْ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ}.

اللە وەڵامی دانەوە بەفەرمایشتی: {أَلَيْسَ اللَّهُ بِأَعْلَمَ بِالشَّاكِرِينَ} [الأنعام: 53]. واتا: (ئایا اللە خۆی لەهەموو کەس زاناتر نیە بەوانەی کە شوکرانە بژێرن؟).

**بابەتی نۆیەم:** چاولێکردن لە زانا فاسیقەکان وعابیدە نەزانەکان، بۆیان هات بەم ئایەتەوە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيراً مِنَ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ} [التوبة: 34]، واتا: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بەڕاستی زۆر لە زانا وعابیدەکان (لە جوولەکە وگاورەکان) سەروەت وسامانی خەڵکی دەخۆن

بەناهەق وڕێگەی لای پەروەردگار دەبەستن وڕێگری دەکەن لەخەڵکی). وە فەرمایشتی: {لا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ غَيْرَ الْحَقِّ وَلا تَتَّبِعُوا أَهْوَاءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا مِنْ قَبْلُ وَأَضَلُّوا كَثِيراً وَضَلُّوا عَنْ سَوَاءِ السَّبِيلِ} [المائدة: 77]. واتا: (زیادەڕەوی مەکەن لە ئاینەکەتاندا جگە لەوە نەبێت کە ڕاست وحەقە وشوێن وئارەزووی گەل وکەسانێك مەکەون کەبەڕاستی پێشتر گومڕا وسەرلێشێواو بوون، وە زۆر کەسیشیان گومڕاکرد وە خۆشیان گومڕابوون ولایاندا لەڕێگای ڕاست).

**بابەتی دەیەم:** بەڵگە هێنانەوە بۆ باطیلی ئاین بە کەمی ئەهلەکەی وکەمی زانستیان، وەك وتەیان:

{بَادِيَ الرَّأْيِ}[1][هود: 27]. واتا (كاڵفام وساویلکەن - ڕواڵەت بینن وە نابینن-)

---

(1) ئەم بابەتە لە بابەتی هەشتەم دەچێت لە ڕووی بەڵگە هێنانەوە، هەردووکیان بەدرۆزانینی پێغەمبەرانیان تیادایە بەوەی کە شوێنکەوتەکانیان بریتی بووە لە لاوازەکان وکەم زانستەکان ، هەروەك گەلەکەی نوح ﷺ گوتیان (وَمَا نَرَاكَ اتَّبَعَكَ إِلَّا الَّذِينَ هُمْ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ الرَّأْيِ وَمَا نَرَى لَكُمْ عَلَيْنَا مِنْ فَضْلٍ بَلْ نَظُنُّكُمْ كَاذِبِينَ) دورکەوتنەوە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەرەکەیان بە بیانوی ئەوانەی کە شوێنی کەوتوون بریتین لە: ( أراذل القوم) واتا: گەمژەکان وزەلیلەکان! کە مەبەستیان پێی لە لاواز وهەژارەکان بوو، وە گوتیان (بادي الرأي) واتا: شوێنت کەوتبوون بێ بیرکردنەوە وبەرچاوڕوونی، بەڵکو بەتەنها بانگت کردن شوێنت کەوتن، گومانیان وابوو کە شوێنکەوتوانی پێغەمبەران لەسەر بەرچاوڕوونی نین، وە بەڕاستی ئەوان دوربین نین! بەڵام لەڕاستی شوێنکەوتووانی پێغەمبەران ئەوان بیریان لەهەموو خەڵکێکی تر

**بابەتی یازدەم: بەڵگە هێنانەوە بە قیاسی وپێوەری گەندە، وەك وتەی: {إِنْ أَنْتُمْ إِلَّا بَشَرٌ مِثْلُنَا} [إبراهيم: 10]. واتا: (وتیان ئێوەش هەر ئادەمییەکن وەك ئێمەن).**

---

ڕێکترە وخاوەن وتە ورەوشتی جوانن وبەڕێزن (الله لەهەموویان ڕازی بێت).

جا جاهیلی سەدەکانی پێشوو چەند بە نەفامەکانی ئەم سەردەمە دەچێت، کە گاڵتە بەشوێنکەوتەی پێغەمبەران دەکەن (موجاهیدان) وە وەسفیان دەکەن بەلاوازەکان، وخەون پوچەکان وکەم تەمەنە نەزانەکان ودۆڕاوەکان، بەڵکو لە فیقهی سەردەم نازانن، پرۆژەیان تێکدانی ئاینە... !! لا حول ولا قوة الا بالله.

# بابەتی دوازدەم: ڕەتکردنەوەی قیاسی وپێوەری دروست [1].

---

[1] لە سیفەتەکانی ئەهلی جاهیلی ئەوەیە کە بەردەوام پشت دەبەستن بەقیاسی خراپ، وقیاسی چاك ودروست ڕەتدەکەنەوە، لەوانەش ئەوەی کە دانەر باسی کردوە، ئەویش بەدرۆزانینی پەیامی پێغەمبەران بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەوان مرۆڤن (کە گوایە ئەمە نابێت)! جا الله وەڵامی ئەوەی دانەوە لەچەندین شوێن لە قورئانی پیرۆز وەك فەرمایشتی: (قُلْ لَوْ كَانَ فِي الْأَرْضِ مَلَائِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِمْ مِنَ السَّمَاءِ مَلَكًا رَسُولًا)، دانایی وواقیع وادەخوازن کە پێغەمبەر مرۆڤ بێت وەك خۆیان بۆ ئەوەی لە وتە وپەیامەکانی تێبگەن، بەڵکو ئەوە لەڕەحمەتەکانی الله_یە کە پێغەمبەر مرۆڤ بێت، ئەگەر پێغەمبەر فریشتە بوایە نەدەتواندرا چاومان پێی بکەوێت وشوێنی بکەوین! سوپاس بۆ الله کە (الله منەتی کردوە بەسەر باوەڕداران کە پێغەمبەرێکی بۆ ناردون لە نەفسی خۆیان).

کۆی ئەوە وئەوەی پێشووی: بریتیە لە تێنەگەیشتن لە کۆکەرەوە وجیاکردەوە [1].

---

لێرەوە قیاسی صەحیح -کە نەزانەکان ڕەتی دەکەنەوە- ئەوەیە کە پێغەمبەری مرۆڤ لە مرۆڤ وپێغەمبەری فریشتە لە فریشتە، وەقیاسی خراپ بیرو بۆچوونی پێچەوانەی ئەوەیە، ئیبن قەیم دەڵێت: هەموو بیدعەیەك ووتارێکی خراپ بناغەکەی لە قیاسێکی خراپەوەیە، وە هیچ شتێك وەك قیاسی خراپ فەرمان وحاڵی زانایەك خراپ ناکات وەك قیاسی خراپ، بناغەی خراپەی دونیا ودوارۆژ بەگشتی لە قیاسی خراپەوەیە [إعلام الموقعين].

1 قیاس: بریتیە لە گەیاندنی لقێك بە بنچینەیەك لەحوکم بۆ کۆکەرەوە لەنێوانیاندا، جا ئەگەر یەکێك لەڕوکنەکان کێشەیەکی تێکەوت ئەوە قیاسەکە باطیڵ دەبێت، بەڕاستی دانەر دەقی هێناوەتەوە ودەڵێت هۆکاری جیانەکردنەوە لەنێوان قیاسی دروست وقیاسی خراپ ئەوە هۆکاری تێنەگەیشتنە (الجامع) کە

**بابەتی سێزدە: زیادەڕەوی وغلو لە زانا وپیاوچاکان،** وەك فەرمایشتی: {يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لا تَغْلُوا فِي دِينِكُمْ وَلا تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ} [النساء: 171]. واتا: (ئەی خاوەن پەڕاوە ئاسمانیەکان زەیادە ڕەوی مەکەن لەئاینەکەتاندا لەبارەی پەروەردگارەوە جگە لە حەق هیچ شتێکی تر مەڵێن).

---

قیاسی دروستی لەسەر دادەمەزرێت، وە تێنەگەیشتن لە (الفارق) کە قیاس لەگەڵی ناگونجێت، بە دەستەواژەیەکی تر ئەوان تێنەگەیشتن لە هۆکاری حوکم بە تێگەیشتنێکی دروست، کە پێویستە هۆی حوکمەکە لە بناغەوە بوونی هەبێت لە لقەکەیدا، ئەگەر هۆکارەکە نەما ئەوە قیاسەکە باطڵە.

**بابەتی چواردە:** هەموو ئەوانەی پێشوو بیناکراون لەسەر بنچینەیەك، كە ئەویش: نەفی وئیثباته[1]، شوێنی ئارەزو وگومان دەكەون، پشت دەكەن لەوەی كە پێغەمبەران هێناویانە.

**بابەتی پازدە:** بیانویان لە شوێنكەوتنی ئەوە كە الله بۆی ناردون بەوەی كە ئەوان تێناگەن، وەك دەڵێن:

---

1 واتا: ئەوان ئەوە جێگیردەكەن كە الله ڕەتی كردۆتەوە وئەوەش ڕەتدەكەنەوە كە الله جێگیری كردوە، الله ﷺ شیركی ڕەتكردۆتەوە وتەوحیدی جێگیر كردوە، ئەوان فەرمانەكەیان پێچەوانە كردەوە تەوحیدان ڕەتكردەوە وشیركیان جێگركرد، بەهەمان شێوە الله حەڵاڵی جێگیركردوە وحەرامی ڕەتكردۆتەوە، هاتن وحەڵاڵیان ڕەتكردەوە وحەرامیان جێگیركرد.

{وَقَالُوا قُلُوبُنَا غُلْفٌ} واتا: به پێغەمبەریان ﷺ گوت کە دڵمان داخراوە: {يَا شُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيراً مِمَّا تَقُولُ}[ هود: 91]، واتا: (ئەی شوعەیب لەزۆرێك لەو شتانەی دەیڵێی تێناگەین)، الله ئەوانی بەدرۆخستەوە وە ڕونی کردەوە کە ئەوە لەبەر ئەوەیە کە دڵیان مۆری لێدراوە، وە مۆرەکەش بەهۆی کوفریانەوەیە.

**بابەتی شازدە:** گۆڕینەوەی ئەوەی کە الله بۆی ناردون بە کیتابی سیحر وجادوو، هەروەك الله تعالى باسی کردوە لە فەرمایشتی: {نَبَذَ فَرِيقٌ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ كِتَابَ اللَّهِ وَرَاءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لا يَعْلَمُونَ

وَاتَّبَعُوا مَا تَتْلُوا الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ} [البقره: 101،102]، واتا: (دەستەیەك لەئەهلی كیتاب پەرتوكی پەروەردگاریان پشت گوێ خست هەروەك ئەوەی كە نەزانن ئەوە پەیامی پەروەردگارە * وە دوای ئەو (شتانە) كەوتن كە شەیتانەكان دەیانخوێندەوە بۆ خەڵكی لەسەردەمی پاشایەتی سولەیماندا).

**بابەتی حەڤدە:** پوچی وباتیڵی خۆیان دەدەنە پاڵ پێغەمبەران، وەك فەرمایشتی: {وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ} [البقرة: 102]، واتا: (سولەیمان بێبڕوا نەبوو)، وە فەرمایشتی: {مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيّاً وَلا نَصْرَانِيّاً} [آل عمران: 67]. واتا: (ئیبڕاهیم نەجوولەكە بووە ونەگاور).

**بابەتی هەژدە:** وتە پێچەوانەکانیان لە خۆدانە پاڵ، خۆیان دەدەنە پاڵ ئیبڕاهیم لەگەڵ وازهێنان لە شوێنکەوتنی[1].

**بابەتی نۆزدە:** تانەدان لە هەندێك لە پیاوچەکان بەهۆی کردەوەی هەندێك لەوانەی لەسەر ئەوان

---

[1] وەك زاناکانی ئال سەلولی ئەمڕۆ، کە خۆیان دەدەنە پاڵ بانگەوازی شێخ محمدی کوڕی عبدالوهاب و نەوەکانی (اللە ڕەحمیان پێبکات)، کەچی کوفر بە تاغوت ناکەن! وجیهاد ناکەن بۆ اللە! بەڵکو دۆستایەتی خاچپەرستان وجەنگی موجاهیدان دەکەن! نمونەیان وەك نمونەی ڕافیزەیە کە بانگەشەی خۆشەویستی عەلی وحوسەین دەکەن -اللە لەهەردوکیان ڕازی بێت-؛ کەچی لەتەوحید وعیبادەت وڕەوشت شوێنی ناکەون، بەڵکو پێچەوانەی ئەوان دەکەن بەتەواوی.

ئەژماردەكرێن، وەك تانەدانی جوولەكە لە عیسا، وتانەدانی جوولەكە وگاورەكان لە محمد[1] ﷺ.

[1] لەرێگەكانی نەزانی ئەوەیە سەیری شوێنكەوتووان دەكەن؛ ئەگەر كارێكی ناشرینیان ئەنجامدا؛ دەیخەنە پاڵ ئەو كەسەی كە ئەوان شوێنی كەوتون (شێخەكە)؛ دەیكەنە بیانوو بۆ وازهێنان لە شوێنكەواتنی! هەر ئەوە بوو كە جوولەكە كردیان بەرامبەر بە عیسا ﵇، كاتێك ئەوان تانەیاندا لە پەیامەكەی كاتێك كە شوێنكەوتووە خاچپەرستەكان لایاندا لە رێگاكەی وایان زانی الله سیانە، یان عیسا خۆی پەروەردگارە، یان كوڕی (الله)یە بەهەمان شێوە جوولەكە وگاور تانەیاندا لە پێغەمبەر ﷺ وپەیامەكەی بەهۆی هەندێك لەوانەی لەسەر ئیسلام دەژمێردرێن لە دەروێش وسەماكاران وئەوانەی هاواردەكەن وگۆرانیبێژەكان ولەخۆدان... تا كۆتایی.

بابەتی بیست: باوەڕیان بەو سەمەرە وکارە نائاسساییانەی جادووگەر وهاوشێوەکانیان بەوەی کە ئەوانە دەیکەن ئەوە کەرامەتی پیاوچاکانە[1]، وە

---

[1] هەرچی ئەوەی کە پێغەمبەران دەیانکرد ئەوە موعجیزەیە بەڵام جگە لەوان سەیری حاڵی کەسەکە دەکرێت، ئەگەر کارێکی لە سروشت بەدەری کرد؛ ئەگەر موەحید و لە الله ترس بوو ئەوە کەرامەتە والله رێز لە دۆستەکانی خۆی دەنێت، بەڵام ئەگەر موشریکێکی خراپ بوو ئەوە جادووگەر وفێڵبازە ولەشەیتانەوە وەری گرتوە، لەگەڵ جێگیربوونی جیاوازی لەنیوان کەرامات وجادوو (بۆ زیاتر: بگەڕێوە بۆ پەرتوکی (النبوات)ی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە)..

بەڵام ئەهلی جاهیلی سیحر وجادوو وفێڵی جادوگەران وکردارە پوچەکانی گۆڕپەرستەکان بە کەراماتی دۆستەکانی ڕەحمان دادەنێن، وە ئەوەش دەکەن بە بەڵگە کە گوایە ئەوان چاکە وسەرفرازی لەسەر دەستیان دێت! بەڵکو لەوەش زیاتر

دەیخەنە پاڵ پێغەمبەران، هەروەك خستیانە پاڵ سولەیمان عليه السلام.

## بابەتی بیست ویەك: عیبادەتكردنیان بە فیكە وچەپڵە لێدان[1].

بەدرۆ ئەوەیان پاڵدا بۆلای پێغەمبەر سولەیمانعليه السلام! لەكاتێكدا ئەو كردارانە كوفرە، اللە پێغەمبەرەكەی بەدوور داناوە لێی، هەروەك دەفەرموێت: (وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ).

[1] اللە تعالی دەفەرموێت: {وَمَا كَانَ صَلاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً} [الأنفال: 35]، واتا: (نوێژی ئەوان لای كەعبە تەنها بریتی بوو لە فیتە وچەپڵە لێدان)، لێرەدا لەمانای (الصلاة) یان مەبەست پێی دوعایە یان كاریكی ترە كە دەیانكرد وناویان دەنا نوێژ، وێنەی ئەو كارانە ناكرێت پێی بڵێی عیبادەت بەڵكو ئەوە لەكارەكانی جاهیلیە، ئەوەش زۆر نزیكە لەوانەی صۆفیەكانی

**بابەتی بیست ودوو:** بەڕاستی ئەوان ئاینەکەیان کردوه بەگاڵتە وگەپ.

**بابەتی بیست وسێ:** ژیانی دونیا فریوی داون گومانیان وابوو ئەگەر اللە بەخششێکی دا بەکەسێك ئەوە واتا لێی ڕازیە، وەك گوتەیان :{نَحْنُ أَكْثَرُ أَمْوَالاً وَأَوْلاداً وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ} [سبأ: 35]، واتا: (ئێمە ماڵ ومنداڵمان زۆرترە وە ئێمە سزا نادرێین).

**بابەتی بیست وچوار:** وازهێنان لە وەرگرتنی حەق ئەگەر لاوازەکان پێش ئەوان وەریانگرت لەبەر خۆ

---

ئەمرۆ دەیکەن لە فیتە وچەپڵە لێدان وگومانیان وایە کە ئەوان اللە دەپەرستن وشوێنی پێغەمبەرەکەی کەوتوون!

بەگەورەزانین ولوتبەرزیان[1]، اللە تعالی فەرموی: {وَلَا تَطْرُدِ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ ...} [الأنعام: 52]، واتا: (نەکەی ئەوانە دەربکەی کە لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوە).

---

[1] ئەوەش نەخۆشیەکی زۆر کوشندەیە کە اللە تعالی گەلانێکی پێ تاقیکردوەتەوە لەم سەردەمە، پشتی کرد لەحەق وخۆی نەگەیاند بە کاروانی خیلافەتی ئیسلامی کە لەساڵی 1435 ڕاگەیاندرا لەگەڵ ئەوەی ئەوان لەژیانی خۆیان بەردەوام بانگەشەی ئەوەیان دەکرد! پێش خیلافەتەکە مەدحی سەرکردەکانی ئەم خیلافەتەیان دەکرد! بانگەوازی خەڵکیان دەکرد بچنە ناو پڕۆژەکەی! گەورەترین هۆکار کەپاڵی پێوەنان خۆبەگەورەزانین ولوتبەرزی بوو! دوای ئەوەی موجاهیدانی ڕێگای اللە هەڵسان بەواجبی دانانی پێشەوا بۆ موسڵمانان ودامەزراندنی دەوڵاتی ئیسلامی ، داوا لە اللە دەکەین بمانپارێزێت لەوەی ئەوانی تری پێتاقیکردەوە.

**بابەتی بیست وپێنج:** بە باتیڵ دانانی ئەو شتەی کە پێش ئەوان لاوازەکان بچنە ناوی، وەك: :{لَوْ كَانَ خَيْراً مَا سَبَقُونَا إِلَيْهِ} [الأحقاف: 11]، واتا: (ئەگەر ئەوە چاك بووایە ئەوانە پێشمان نەدەکەوتن).

**بابەتی بیست وشەش:** گۆڕینی پەرتوکی اللّٰه دوای ئەوەی تێیگەیشتن وزانیان.

**بابەتی بیست وحەوت:** دانانی پەرتوکی باتڵ وپوچ و خستنە پاڵی اللّٰه، وەك فەرمودەی اللّٰه: {فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ يَكْتُبُونَ الْكِتَابَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ} [البقرة: 79]، واتا: (هاوار بۆ ئەوانەی پەرتوك

دەنوسن بەدەستەکانیان پاشان دەڵێن لەلایەن اللە دابەزیوە).

**بابەتی بیست وهەشت:** ئەوان شتێك لەحەق وەرناگرن تەنها ئەوە قبوڵ دەکەن کە لەگەڵ کۆمەڵەکەی خۆیانە، وەك فەرمایشتی: {قَالُوا نُؤْمِنُ بِمَا أُنْزِلَ عَلَيْنَا}[البقرة: 91]، واتا: (گوتیان باوەڕدەهێنین بەوەی بۆمان دابەزیوە).

**بابەتی بیست ونۆ:** ئەوان لەگەڵ ئەوەش لەوە تێناگەن کە کۆمەڵەکەی خۆیان دەیڵێت: هەروەك اللە پێمانی ڕاگەیاندوە لە فەرمایشتی: {قُلْ فَلِمَ

تَقْتُلُونَ أَنْبِيَاءَ اللَّهِ مِنْ قَبْلُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ}[البقرة: 91]، واتا: (پێیان بڵێ بۆچی پێغەمبەرانتان کوشت ئەگەر بەڕاستی باوەڕتان پێیان هەیە).

**بابەتی سێ:** ئەوەش لە سەرسامکەرەکانی ئایەتەکانی (اللّٰه)یە! کاتێك ئەوان وازیان هێنا لەفەرمانی اللّٰه کە وەسیەتیان دەکات بە یەکڕیزی وکۆمەڵبوون، وە پارچە پارچەیی وجیاکاریان ئەنجامدا کە اللّٰه نەهی لێکردوە؛ هەموو حیزبەکان دڵ خۆشن بەوەی لەسەرینە.

**بابەتی سی ویەك:** ئەوەش لە هەرە سەرسامترین ئایەتەکانی (اللّٰه)یە! دوژمنایەتیان بۆ ئەم ئاینەی کە خۆیان دەدەنە پاڵی گەیشت بەلوتکەی دوژمنایەتی، خۆشەویستیان بۆ ئاینی کافران -ئەوانەی کە دوژمنایەتی پێغەمبەر وکۆمەڵەکانیان کرد- بەو پەڕی خۆشەویستی بۆیان، هەروەك ئەنجامیاندا لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کاتێك بەئاینی موسا ؑ هات بۆیان، ئەوان شوێنی پەرتوکی جادوو کەوتن، کە ئەوە لە ئاینی ئالی فیرعەون بوو.

**بابەتی سی ودوو:** بێ باوەڕبوونیان بە حەق ئەگەر لای کەسانێك بوو کە حەزیان پێناکەن، هەروەك

اللّٰه تعالى دەفەرموێت: {وَقَالَتِ الْيَهُودُ لَيْسَتِ النَّصَارَى عَلَى شَيْءٍ وَقَالَتِ النَّصَارَى لَيْسَتِ الْيَهُودُ عَلَى شَيْءٍ} [البقرة: 113]. واتا: (جوولەکەکان گوتيان گاورەکان لەسەر هيچ ئاينێك نين وگاوەرەکانيش گوتيان جوولەکەکان لەسەر هيچ ئاينێك نين).

واتا: (جوولەکەکان گوتيان گاورەکان لەسەر هيچ ئاينێك نين وگاورەکانيش گوتيان جوولەکەکان لەسەر هيچ ئاينێك نين).

**بابەتی سی وسێ:** نکۆڵيکردنيان لەوەی کە دانيان پێنابوو کە ئەوە لەئاينی ئەوانە، هەروەك کرديان

لەسەر حەج[1]، الله تعالى فەرموی: {وَمَنْ يَرْغَبُ عَنْ مِلَّةِ إِبْرَاهِيمَ إِلَّا مَنْ سَفِهَ نَفْسَهُ} [البقرة: 130]، واتا:

---

[1] هەروەك جوولەكە كردیان، ئەوان پێیانوایە لە سەر ئاین ومیللەتی ئیبراهیم پێغەمبەرن ﷺ، لە هەمان كاتدا كەعبە بە ڕوگە دانانێن وحەجیش بە عیبادەت دانانێن، هەروەك هاوەڵگەرانی قوڕەیش خۆیان دەدەنە پاڵ ئیبراهیم ﷺ، وە دان دەنێن بەوەی حەج لەو عیبادەتانەیە كە ئەو كردویەتی، بەڵام لە عەرەفات ناوەستن لەگەڵ خەڵكی، بەڵكو دەوەستن لە موزدەلیفە، وەك خۆجیاكردنەوە لەوانی تر.

تاوەكو ئێستا ئەهلی جاهیلی ئەوە دەكەن، چەند لەوانە دەپرسین كە لەسەر ئیسلام دەژمێردرێن ونكۆڵی ئەوە دەكەن كە دیموكراسی كوفر بێت، بەڵكو بەرگری لێدەكەن ودەڵێن ئەوە شوڕایە ولە بنەچەی ئاینی ئیسلامە! هەروەك لەوانە دەبیستن كە بەخۆیان دەڵێن موسڵمان ونكۆڵی جیهادی داواكردن (الطلب) دەكەن، وە مشت ومڕ دەكەن كە الله جیهادی تەنها بۆ بەرگری

(کێ هەیە جگە لەگەمژەکان کە میللەتی ئیبراهیمی نەوێت).

**بابەتی سی وچوار:** هەر کۆمەڵە وبانگەشەی ئەوە دەکات ئەو کۆمەڵەی ڕزگاربووە (الناجیة)، اللە ئەوانی بەدرۆخستەوە بە فەرمایشتی: {قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ} [البقرة: 111]، واتا: (پێیان بڵێ کوا بەڵگەتان ئەگەر ئێوە ڕاستگۆن)،

---

داناوە! زۆ لەوانە دەبیستین کە نوێژکەرن بەڵام گوێ دەگرن لە گۆرانی وسەیری زنجیرە دراماکان دەکەن، ئەگەر یەکێك ئامۆژگاری کردن دەڵێن: ئەوە لە هونەرە ڕێگە پێدراوەکانە کێ گوتویەتی کە اللە گۆرانی ودراماکانی حەڕام کردوە! داوا لە اللە دەکەین بمانپارێزێت.

پاشان ڕاستیەکەی ڕونکردەوە بەفەرمایشتی: {بَلَى مَنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ} [البقرة: 112]، واتا: (بەڵێ ئەوەی کە ملکەچ بێت وڕوبکاتە اللّٰه ئەوە لەچاکەکارانە).

**بابەتی سی وپێنج: عیبادەتکردن بەڕوتی وبێ جلوبەرگ**[1]، وەك فەرمایشتی: {وَإِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً

---

[1] ئیبن کەثیر لە ڕاڤەکەیدا دەڵێت: (موجاهید دەڵێت: هاوەڵگەڕان تەوافی کەعبەیان دەکرد بەڕووتی، دەیانگوت: ئێمە تەواف دەکەین بەم شێوەیەی کە سەرەتا لەدایك بووین بێ جلوبەرگ، ئافرەت پەتێکی لەسەر داوێنی دادەنا، یان شتێکی تر، ودەیگوت: ئەمڕۆ کە هەندێکی یان هەمووی بەدەرەوە بێت، لەوە زیاتر بە حەڵاڵی نازانم دەرکەوێت، اللّٰه فەرموی: {وَإِذَا فَعَلُوا

